# چەمکی شوێن لە چامەی
# (قوربانی تۆزی ڕێگەتم)ـەکەی (نالی)دا

**بارزان عەلی**
**(ڕانیە)**

شوێن لە ئایدیای زۆربەی میللەتانی دنیادا گرنگی و ماهییەتی خۆی هەیە و بە جددی ئیشیان لەسەر کردووە. شارستانییەت پێمان دەڵێ هەندێ چیا و شوێن دەکەونە ناوەڕاستی دنیاوە و لەوێوە جیهان دەستی بە دروستبوون کردووە، هەروەها لە ئایینی زەردەشتیدا ئێران دەکەوێتە ناوەڕاستی دنیا و لای هیندییەکان چیای (ئەلبورز) ناوەڕاستی گەردوونە.

گەرچی شوێن و کات دوو بنەمای سەرەکی کاری ئەدەبین و بەهۆی ئەو پەیوەست بوونەی ئەدەب بە دنیای شوێن و کات و کەسێتییەوە ڕووداوەکان دەچەرخێن، هەر بۆیە لە لێکۆڵینەوەی چەمکی شوێندا، دووچاری ئەو زەمەنەش دەبین، کە شوێن خۆی تێدا نمایش کردووە، بۆیە (کات و شوێن) لە ئەدەبدا وەک دوو ڕووی دراوێکیان لێ هاتووە و ناشێ لە لێکۆڵینەوەی (شوێن) بە تەواوی پشت لە (کات) بکرێت، چونکە لە دەرئەنجامی تێکچڕژانی کار و کاردانەوە و کارلێکی (کات و شوێن)دا و خۆگونجان لەگەڵ ڕووداو و پرسیارەکانی ناو چامەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم)ـەکەی نالی دا شوێن لەنێو دەقەکەدا پێگەیەکی قورسی هەیە و خامەی پرسیارەکانی شاعیرە، لەلایەکی ترەوە شوێن لە چامەکەدا کلیلی کردنەوەی گەلێک پرس و ڕازی نالی-یە.

شوێن لە چامەکەدا پانتاییەکی فراوانی هەیە، چەندان جۆر شوێن بەدی دەکرێت و لە زۆر جێگەدا شوێن تاکە هۆکاری فلاشباکەکان و دەربڕینی هەستی نۆستالیژی شاعیرە، داواجار شوێن بووەتە قاسیدێک بۆ گەیاندنی ئەو هەموو بەسەرهات و نەهامەتییانەی کوردانی ژێر فەرمانڕەوایی ئەمارەتی بابان و دەوروبەریشی، هەر ئەمەیشە شوێن ئەو بەها ئیستێتیکییەی لە چامەکەدا وەرگرتووە.

شوێنەکانی وەک (شارەزوور، بەکرەجۆ، سەرچنار، خانەقا،...تاد) مۆرکی چامەکانیان وەرگرتووە، چونکە هەر ڕووداوێک کە ڕوودەدات زەمینەیەکی ئاشکرا و کاتێکیش هەیە بۆ ڕوودانی ڕووداوەکە، بۆیە ڕووداوەکە پەیوەستدار دەبێت بەو کات و شوێنەوە کە تێیدا ڕووی داوە، هەر ئەم پەیوەستیدارییەشە هەناسەیەکی سەرمەدی بە چامەکە داوە.

(ئیبراهیم جنداری) دەڵێ: ماهیەتی وەسفی شوێن و کەس و شتەکان هیچی کەمتر نییە لە گێڕانەوەی ڕووداو و کردارەکانی، هەروەها شوێن یەکێک بووە لەو چەمکە گرنگانەی، کە هەر لەسەرەتای هۆشیاربوونەوەی مرۆوە بە گرنگییەوە سەیری کراوە، (هەر لە هەڵبژاردنی شوێنی حەوانەوە و نزیکی لە سەرچاوەی ئاو و دوورکەوتنەوە لە



**نالی**

ناوچەی سەخت و گیانداری درندە) بۆ ژیان، هەروەها لەنێو دەقی ئەدەبیشدا، لێکۆلەرانی ئەدەب خۆ لادان و فەرامۆش کردن و وەسف و گرنگی نەدان بە شوێن، بە خاڵی لاوازی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی دادەنێن. لەم بارەوە (غالب هلسا) لە پێشەکی کتێبی (جوانکاری باشلار)دا دەڵێ: (هەر کارێکی ئەدەبی ئەگەر شوێن فەرامۆش بکات، ئەوە تایبەتمەندی و رەسەنایەتی خۆی لەدەست دەدات)،«١»، هەروەها (یاسین نەسیر) لێکۆلەری بواری ئەدەبی، ساڵانێکی زۆری بۆ لێکۆڵینەوەی شوێن تەرخان کردووە، بەمە بۆچوونێکی زانستی و دیالێکتیکی دایە چەمکی شوێن لە تیوری ئەدەبدا، چونکە بەلای ئەوەوە شوێن رۆڵێکی دیار لە چنینی رووداوەکانی دەقدا دەگێرێ. یاسین نەسیر لە سەدەی بیست تا سەرەتای سەدەی بیست و یەک، شەش کتێبی لەبارەی چەمکی شوێن لە ئەدەبدا چاپ کردووە، بەپێی بۆچوونی خۆی شوێنی لەنێو ئەدەبدا دابەشی سەر سێ جۆر کردووە:

١- شوێنی گریمانکراو (المكان المفترض)/ ئەم جۆرەی شوێنی دابەشی سەر دوو لقی شوێن کردووە:

أ/ شوێنی یۆتۆپی گریمانکراو.

ب/ شوێنی کۆمەڵایەتی گریمانکراو.

٢- شوێنی بابەتی (المكان الموضوعي)/ شەقڵی ئەم جۆرە شوێنە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە پێکهێنەرەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە وەردەگیرێن و واقیعی گشتی بەسەر بارودۆخەکەدا دەیسەپێنێ، تایبەتیشە بە شوێنی داخراو. وەک (بەندیخانە، دوورخراوگە، بەرەی جەنگ،...تاد)«٢»، زۆربەی ئەو نووسینانەی کە شوێنی داخراویان زۆرە، ئەوە نووسینەکانیان بەلای نووسینی رامیاری و هەستی نیشتمانییەوە دەشکێتەوە.

٣- شوێنی تاک رەهەند (المكان ذو الحد الواحد)/ ئەم جۆرەی شوێن لەلای یاسین نەسیر، پێچەوانە و دژی جۆری یەکەم (شوێنی گریمانکراو) دادەنرێت. ئەم جۆرەی شوێن لە بواری ئەدەبیدا پێناسی تایبەت بەخۆی و چینایەتی و کۆمەڵایەتی بەدەست هێناوە. وەک (ماڵ، شەقام،...تاد) گشتێن، نووسەری ئەدەب بەم مەبەستە ئاوڕی لێ ناداتەوە، کە بەشێکە لە بینایی کارە هونەرییەکەی، بەڵکو هزر و کەسایەتی تێ دەئاخنێ بێ ئەوەی رۆڵێکی بەرچاویان هەبێ. شوێن سێ رەهەندی (درێژی، پانی، بەرزی)هەیە، دواتر یاسین نەسیر رەهەندی چوارەمی بۆ زیاد کرد، کە ئەویش رەهەندی (کات)ـە.

لەنێو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردیدا، لەم چەند ساڵەی رابردوودا (لوقمان رەئووف) لە نامە ئەکادیمییەکەیدا کە بەناوی (رەهەندەکانی شوێنکات لە دەقە والاکانی شێرکۆ بێکەسدا) چاپی کردووە، چەمکی شوێنکاتی بۆ بەکار هێناوە.

شوێن لە دیدی فەیلەسووفانەوە: بیری شوێن هەر لە دێرینەوە سەرنجی فەیلەسووف و زانایانی راکێشاوە و بووەتە مایەی لێکۆڵینەوە و قسە لەسەر کردن. ئەفلاتوون (٤٢٧-٣٤٧)پ.ز، یەکەمین فەیلەسووفە باسی چەمکی شوێنی کردووە: (شوێن گرتنەخۆ و تێدابوونە، کە بوونێکی راستەقینەی هەیە و لە سێ دووری -درێژی، پانی، بەرزی- پێکدێ)«٣»، دوای ئەم گرنگی پێدانەی ئەفلاتوون، چەمکی شوێن لەلای فەیلەسووفان و زانایان، شوێن تایبەتی و گرنگی خۆی پێدرا، هەروەها (باشلار)یش بۆچوونی خۆی لەمەڕ چەمکی شوێن دەربڕی: (کارێکی ئەدەبی ئەگەر شوێن فەرامۆش بکا، ئەوە تایبەتمەندی و رەسەنایەتی خۆی لەدەست دەدات)«٤»، ئەگەرچی باشلار لە کتێبی (جوانکارییەکانی شوێن) تەنیا یەک جۆر شوێن (هۆگرە شوێن)ی باس کردووە، ئەویش بە دیوی فەلسەفییەوە.

هەرچی ئەرستۆیە (٣٨٤-٣٢٢)پ.ز، کە بە یەکەم تیورنووس دادەنرێت، ئەویش لە کتێبی هونەری شیعر (پۆیەتیکا)دا شوێنی دابەشی (شوێنی گشتی و شوێنی تایبەتی) کردووە.

شوێنی گشتی بەلای ئەرستۆوە ئەو شوێنەیە کە گشت شتەکانی لەخۆ گرتووە، هەروەها شوێنی تایبەتیش ئەو شوێنەیە کە بوونی هەبێ، ئەویش خودی شتەکەیە.

هەروەها (پۆل و ڕۆمیز) شوێنیان بۆ چوار جۆر دابەش کردووە، کە بریتین لە:

١- شوێنی من/ ئەو شوێنەیە کە دەسەلاتی (من)ی تێدا بەگەڕ دەخرێت، شوێنێکی هۆگرە و لەژێر ڕکێفی (من)دایە.

٢- شوێنی ئەوانی تر/ لە هەموو ڕوویەکەوە هاوبەشە لەگەڵ (شوێنی من)، بەلام لەوەدا لێک جودان، کە (من) تێیدا ملکەچە بۆ ئەوانی تر و دەبێ دان بەو دەسەلاتەشدا بنێ.

٣- شوێنی گشتی/ شوێنەکە مولکی کەس نییە، مولکی دەولەتە، وەک (فەرمانگەی میری، نەوای ئارام،...) دەسەلاتداران هێزی خۆیانی تێدا دەخەنە کار.

٤- شوێنی تاک/ ئەم شوێنە مولکی کەس نییە و کەس خۆی بە خاوەنی دانانێ و هەموو کەس دەتوانێ بۆی بچێ و تێیدا بژی، بەلام دوورەدەستە، بۆیە سیمای شوێنی تایبەتی هەیە، وەک (ئەشکەوت، دوورگە، بیابان،... تاد).

وەک (واتا) و هەلگری واتای تایبەتی بە شوێنەکان (شۆلز) پێنج واتا بۆ پانتایی شوێن جیادەکاتەوە، ئەوانیش:

١- پانتایی پراگماتیکی.
٢- پانتایی درک پێکراو.
٣- پانتایی مەعریفی.
٤- پانتایی بوونی.
٥- پانتایی لۆژیکی.

هەروەها نووسەر و توێژەرانی عەرەبیش بەهای تایبەتییان بۆ چەمکی شوێن داناوە، لەوانە (کندی ٨٧٠-٩٥٠)، و (غالب هلسا ١٩٣٢-١٩٨٩)، نوێخواز و خاوەن گوتەی (کاری ئەدەبی بە فەرامۆشکردنی شوێن، تایبەتمەندی و ڕەسەنایەتی خۆی لەدەست دەدات) و شوێنیش دابەشی سەر سێ جۆر شوێن دەکات:

١- شوێنی خوازەیی/ ئەم شوێنە بوونی نییە و بۆ یۆتۆپیا دەگەڕێتەوە.

٢- شوێنی ئەندازەیی/ ئەو شوێنەیە کە دەق لە وەسفی دووری و بەرزی و قەبارەیی دەیخاتە ڕوو.

٣- شوێنی تاقیکراوە/ ئەو شوێنەیە کە دەقنووس تێیدا ژیاوە«٥»

### جۆرەکانی شوێن لە چامەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم)ـەکەی نالی-دا

**شوێنی واقیعی/** لە قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم)ەکەی نالی-دا شوێنگەلێکی زۆری واقیعی بەرچاو دەکەون و بەشێکن لە واقیعی دانپێدانراوی سروشتی، بۆیە نالی شوێنی ڕووداوەکان بەپێی شوێنی بینراو دەخاتە ڕوو. شوێنی واقیعی ئەو شوێنەیە، کە واقیع بەشێوەیەکی هونەری جوان بۆ دنیای وەرگر دەگوێزێتەوە و هەستی ڕاستی بەرانبەر بە خوێنەر، یان گوێگر دەبەخشێ، ئەم شوێنە جوگرافیای خۆی هەیە و خوێنەر دەتوانێ بیبینێ. کەواتە شوێنی واقیعی ئەو شوێنەیە کە لەسەر زەوی بوونێکی ڕاستی هەیە و مەودایەکی داگیرکردووە و مرۆ بەسانایی دەتوانێ بۆی بچێ. نالی بەم بەیتە دەست بە چامەکە دەکات:

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور!**
**وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری (شارەزوور)!**

دواتر دەلێ:

**داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی (خاک و خۆڵ)**
**هەتا نەگەی بە خاکی (سولەیمانی)، یان عبوور**

هەریەک لە شوێنەکانی (خاک و خۆڵ، شارەزوور، سلێمانی،...تاد) شوێنی واقیعین. نالی لەم نموونانەی ناوی هێناون چەند ناوچەیەکی جیاوازن و هەریەکەشیان لەڕووی شێوە و مێژووەوە لێک جودان، هەروەها دەشێ ئەم جۆرەی شوێن بە (شوێنی واقیعی جێگیر) ناوی ببەین، چونکە شوێنەکان جێگیر و نەگۆڕن، ئێستا و لە ڕابردوو و ڕەنگە داهاتووش وەک خۆیان بە نەگۆڕی و جێگیری بمێننەوە.

**شوێنی خەیاڵی/** ئەو شوێنەیە، کە نالی لە خەیاڵ و هزری خۆیدا دروستی کردووە. ئەم جۆرەی شوێن لە چەند دێڕێکی ئەم چامەیەدا بەرچاو دەکەوێ و زادەی خەیالی شاعیرە، هەروەک لە دەستپێکدا دەلێ:

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور!**
**وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری (شارەزوور)!**

شاعیر دەلێ (تۆزی ڕێگەت)، تۆز لە باوە هەلناستێ، بەلکو تۆز هەستان دەرئەنجامی جوولەی با ئاشکرا دەکات، با ڕێگەی نییە، تەنیا (بای باکوور و بای باشوور) وەک ئاراستە و ڕێڕەوی با هەیە نەک ڕێگەی با، کەواتە (ڕووی قسەی نالی لە بای سروشتی نییە،

ســـیفـــەتی پەیکی شـــارەزا، خـــەیاڵی دەســـتکردی شیعـرەکـەیەتی)«٦»، چونکە تۆزی ڕێگە بۆ پەیکێکی شارەزا، شوێنێکە خەیاڵی نالی خوڵقاندوویەتی دەنا لە واقیعدا نابینرێ.

**شوێنی کراوە/** سنوورێکی دیاریکراوی نییە و بڵاوە، بۆیە پانتاییەکی بەرفراوان و بێ کۆتای هەیە، ئەم جۆرەی شوێن پاوانی کەس نییە و گشتییە، زۆر جار ئەم جۆرەی شوێن موڵکی میریش نییە و ئاوەڵایە. (پۆڵ و ڕۆمیز) پێیـان وایە (ئەو شـوێنەیە، کـە لەژێر دەسـەڵاتی کـەسدا نیـیـە، تەنانەت مـیـریش، بۆیە ئەم شـوێنە دەلالـەتی تایبـــەتی وەردەگــــرێ. وەک (چیــــا، ئەشکەوت، بیابان،...تاد)«٧»، کەواتە ئەو شوێنانە دەگرێتەوە، کە لەبەردەم هەموو کەسێکدا والآن، بێ ڕەچاوکردنی ڕەگەز و تەمەن و چین، واتە لە ڕاستیدا هیچ کەسێک ناتوانێت ئەم شوێنانە پاوان بکات و بە موڵکی خۆی دابنێت.

**ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی (سەرچنار)**

**ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور**

سـەرچنار و ئاوەکـەی تا ئێســتـاش هەر بە کـراوەیی مـاونەتەوە و مـوڵکی کـەسیی نییـە و دوورە لە دیاردەی پاوانخـوازی. ئەم شوێنە لای نالی خـاڵی نییـە لە مرۆ و دەسەڵاتی بەسەرەوەیە، بەوەی ئەگەری ئەوە هەیە ناوچەی گەشتیـاری سـەرچنار و کانیی سەرچنار لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا مۆرکی گەشتوگوزاری لێ داماڵرابێ.

**شوێنی داخراو/** ئەو شوێنەیە کە قەبارە و سنوورێکی دیاریکراوی هەیە و بەپێچەوانەی شوێنی کراوە، لەبەردەم کەسەکـاندا داخـراو و سنووردار کـراوە. لوقـمـان ڕەئووف دەڵێ: (لە ڕوانگەی ئیبراهیم جندارییەوە شوێنی داخراو لەبەردەم کـەسـەکـاندا داخـراو و سنووردارە و ڕووبـەرێکی جـوگــرافی دیاریکراوی هەیە، هەمـــوو کــەس نـاتوانێ بەسەربەستی هەڵسوکەوتی تێدا بکات، تەنیا کەسێک، یان چەند کـەسێک نەبێت)«٨»، کەواتە شوێنی داخراو تایبـەتە بە کـەسێک، یان چەند کـەسێک، واتە هەمـوو کەس سەربەستی ئەوەی نییە بە ئارەزووی خۆی بەکاری بهـێنێت. ئەم جۆرەی شـوێن (مـاڵ، ئەشکەوت، زیندان، حوجرە، ...تاد) هەیانە شوێنی هۆگرە و هەشیانە ناهۆگر و بێزارگەیە.

جیاوازی نێوان شوێنی کراوە و داخراو، پەیوەستدارە بە شوێنی تایبەت و گشتییەوە، ئەگەر شوێنەکە تایبەت بوو بە کەسێ یان چەند کەسێ، ئەوە داخراوە، ئەگەر گشتیش بوو هەمـوو کـەس توانی سـەردانی بکات، ئەوە شـوێنی کراوەیە.

**واسیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم**

**چی ماوە، چی نەماوە، لە هەیوان و تاق و ژوور؟**

شوێنەکانی (حوجرە و لەناویشیدا هەیوان، تاق، ژوور) شـوێنی داخـراویان هەیە، مـافی کـەسـێک، یان چەند کـەسـێکە لە بەکـارهێنانیـدا. قـەبارەی سنووری هەر یەکێکیشیـان ئاشکرا و ڕوونە، هەروەها دەسەڵاتی تاکی تێـدا پراکـتـیـزە دەکـرێت و هۆگـرە و لەژێر دەسـەڵاتی کەسێکدایە، ئەگەرچی نالی لە مەنفاوە دەسەڵاتی بەسەر حوجرەکەیدا ناشکێ.

**شوێنی هۆگر/** ئەو شوێنەیە، کە مرۆ سۆز و ئولفەتێکی زۆری بۆ هەیە. باشـــلار بە (شــــوێنی منداڵـی) ناوی دەبات، چونکە شوێنی هۆگر لە دیدی شاعـیرەوە زۆر لە یادگـاری و ژیانی منداڵی تێدا دەبینێـتەوە و بەجـۆرێک شـاعـیـر هەسـتی ئارامی بەرانبـەر ئەم شـوێنانە هەیە و بوونەتە کێڵگەی یادەوەری شاعیر.

ئەم جـۆرەی شـوێن لای نالی بە جـۆرێکە، کـە ڕادەی هۆگـری شـاعـیـر بەرانبـەر بە شـوێنە هۆگـرییـەکـان لە لوتکەدایە. لەچامـەی (قـوربانی تۆزی ڕێگەتم)دا ئەم جۆرەی شوێن زۆر دەبینرێت و گرنگی تەواوی پێ دراوە، چونکە نالی لـە تاراوگە (شام) ئەم چامەیەی نووسیوە و پڕیەتی لە فـلاشبـاک و دەربڕینی سۆز بەرانبـەر بە زێدی خـۆی و گـەڕانەوە بۆ یادگـارییـەکـانی، هەروەها بەلای نالی-یەوە سلێـمـانی پیـرۆزترین شـوێنە لـەم کـەونەدا، بەجۆرێ لە پلەیەکی تەواو (کەماڵ)یدایە.

**ئایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە،**

**یا مەسڵەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی سوور؟**

ڕامـان لەم دێرە شـیـعـرە، بەسـە بۆ تێگەیشتن لەو کەڵکەڵە دەروون هەژێنەی گەڕانەوەی نالی بۆ زێدی خۆی و سەرتاپای بیری تەنیوە، چونکە بیری گەڕانەوەی نالی پێـوەندی پتـەوی بە لایەنی ســایکۆلۆژییـــەوە هەیە و بەردەوام مەیلی گەڕانەوەی بۆ نیشتمانی لەدەست چووەوە هەیە. ئەگەر ئەم هەوڵە جددییەی شاعیر و عەوداڵبوونی گـەیشـتنەوەی بە نیـشـتـمـان ڕەنگدانەوەی بیـرەوەری و یادگارەکانی نەبێت ئەی دەبێ چی بێ؟ بۆیە شوێنی هۆگر لەم قـەسـیـدەیەدا کـاریگەرییـەکی بەهێـزی بە دەروون و هەڵسـوکـەوتی شـاعـیـرەوە هەیە و ڕەنگە کـاردانەوەی کـارەکی دەروونی بەسـەریەوە هەبووبێ و کـاریشی لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانە و خەون و خەیاڵی کردبێ. نالی ئەم چامـەیەی کـردووە بە سـەردابێک بۆ دەربڕینی هەسـتی

نۆستالیژی و ئۆقرەشی لێ بڕیوە، ڕاستییەکەی لای نالی هەستی بیرکردنی نیشتمان بەسەر هەستی نەتەوایەتیدا زاڵە، چونکە لەم چامەیەدا ڕوونە نالی بیری نیشتمان دەکات، نەوەک بیر لە نیشتمان دەکاتەوە! و ئەم دوو چەمکەش زۆر لەیەک جودان، ئەمەش بەسەر نەکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی لای نالی لەناو چامەکەدا نیشان دەدات، چونکە هەستی نۆستالیژی بە جۆرێ شاعیری خستووەتە دۆخێکی نالەباری دەروونییەوە، کە هەستی بیرکردنی نیشتمانی زۆر زاڵ کردووە بەسەر بیرکردنەوە لە نیشتمان.

**سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو (خانەقا) بکە**
**ئایا ڕەبیعی ئاهووە، یان چایری ستوور؟!**

ئەو شوێنەی کە نالی باسی دەکات (خانەقا) شوێنێکە ئاشنایەتی شاعیر و هۆگربوونی بە خانەقا و لەناو خانەقاکەشیدا ژوورەکەی، نالی تا ئەوپەڕی بیرکردنی جەختی لە هۆگربوونی دەکات. لەم دێڕە شیعرە سۆزاوییەیدا، تا دێ جەزببوونی هەستی زیاتر بە شوێنی تایبەتییەوە گیردەبێ. نالی هیچ کام لە شوێنەکانی (شارەزوور، شیوەسوور، سەرچنار، سەیوان، تانجەرۆ، پردی سەر شەقام، بەکرەجۆ،...تاد) لە یادکردنەوە و سۆزی بێ بەش نەکردووە و بە ناوهێنانی شوێن و ناوی شەخسەکان پردێکی بەهێزی لە سۆز و هۆگری لەنێوان خۆی و شوێنەکان دروست کردووە.

**شوێنی ناهۆگر/** ئەو جۆرەی شوێن، کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤەکان ناگونجێ، یان مرۆ حەزی پێی نایەوێت و نایەوێ تێیدا بژی، یان ئەگەر تێشیدا بژی ئەوە ناچار کراوە بە تێدا ژیانی، ئەگەرنا مرۆ بە ویستی خۆی مەیلی بۆ ئەم جۆرەی شوێن نییە.

شوێنی ناهۆگر لە چامەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم)ـەکەی نالی دا کەم بەدی دەکرێ، لە دوو حاڵەتی لێک دژدا هەستی پێدەکرێ:

أ- ئەو شوێنەی نالی وەک تاراوگەنشینێک لە تاراوگەکەیدا شیعرەکەی تێدا نووسیوە و ناردوویەتی بۆ (شارەزوور-سلێمانی). لە کوێی پانتایی واتایی دەروونی دەقەکە خوێنەر هەست بە نا ئاسوودەیی و نیگەرانی و بێزاری نالی دەکات لەو شوێنەی تێیدا دەژی(شام)، تەنانەت هەستی بەزەییشمان بۆی دروست دەبێ، ئەمەش بەهۆی ئەو مەیلە زۆرەی گەڕانەوەی بۆ زێدی خۆی ئەم ناهۆگرییەی بە شامەوە بۆ دروست بووە.

**ئایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە،**
**یا مەسڵەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی سوور؟**

دەربڕینی (بێمەوە) بەڵگەی ڕاستی بۆچوونەکەمانە، کە هەستی ناهۆگری بەم شوێنەی تێیدا دەژی هەست پێ دەکرێ.

ب- ئەو شوێنانەی کە هۆگری شاعیر پێیەوە نیشان دەدات، بەڵام لە ئەنجامی تێکچوونی بارودۆخی ئەمارەتی بابان بە دەستی دەوڵەتی عوسمانی. کوێی شوێنەکان نالی لە (مانەوەی وەک جاران)یان دەپرسێ، چونکە تورکەکان بارودۆخێکی ناسەقامگیریان دروست کردبوو، شاعیر لەوە تێگەیشتووە ئەو شوێنە هۆگرانە (پردی سەر شەقام، کانی با، کانی ئاسکان، خانەقا، بەکرەجۆ،...تاد) هەروەک جاران خەڵکی بە جۆش و خۆشییەوە ڕووی تێ دەکەن، یان تورکەکان بارودۆخێکیان خوڵقاندووە مرۆ حەزی بۆ چوون و بینینی ئەم شوێنانە نەماوە.

**قەلبی موونەوەرە لە حەبیبانی نازەنین**
**یا وەک سەقەر پڕە لە ڕەفیقانی لەندەهوور*؟**

وشەی (سەقەر) کە بە مانای دۆزەخ دێ لە بەرانبەر وشەی (خانەقا)دا هاتووە، واتا تورکەکان کەشوهەوای خانەقای خواپەرستی و مەحەببەتیان گۆڕیوە بۆ جەهەننەمێکی پڕ لە لەندەهوور، بۆیە ئەم جۆرە لە شوێن مرۆڤ حەزی پێی نایەت و ناهۆگرە و ژیانی ناو سلێمانی سزای ڕۆژی دوایی بەبیر ئێمەدا دێنێتەوە. سالم-یش لە وەڵامەکەی ئەم چامەیەی نالی دا ڕاشکاوانە دەڵێ:

**توخوا بڵێ بە حەزرەتی (نالی) دەخیلی بم**
**بەم نەوعە قەت نەکا بە سولەیمانیا گوزەر**
**(سالم)سیفەت لە بێکەسییا با نەبێ هیلاک**
**من کردم ئەو نەکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر**

(سالم) وەڵامێکی ڕاشکاوانە بۆ نالی دەنێرێت (هەرچەندە بەڵگەیەکی سەلمێنراوی بەردەست نییە کە چامەکەی سالم بە دەستی نالی گەیشتبێ)، کە جارێکی تر بیر لە سلێمانی نەکاتەوە و کەڵکەڵەی گەڕانەوەکەی بکوژێت. نالی بەوە ناوەستێ و لە پرسیار ناکەوێ و دەڵێ:

**توخوا فەزایی دەشتی فەقێکان ئەمێستەکەش**
**مەحشەر میساڵە، یان بووەتە (چۆڵی سەلم و توور)؟**

شاعیر شوێنی(چۆڵی سەلم و توور)ی ناهۆگری بەرانبەر بە (فەزای دەشتی فەقێکان)ی هۆگر هێناوە، کەواتە شوێنی ناهۆگر ئەو شوێنەیە کە مرۆ حەزی پێ نییە و تێدابوونی دژوارە و لە توانایی مرۆ بەدوورە و هونەر

کوژە، بەجۆرێک مرۆڤ حەز ناکات هەر بیریشی لێ بکاتەوە.

**شوێنی نادیار/** نالی کۆتایی پرس و هەڵوەداکانی بە شوێنی نادیار، کۆتایی هێناوە. شوێنی نادیار هۆکارێکە بۆ نووسەران تا نووسینەکانیان بخەنە فیگەرێکی جوانی شاراوەییەوە بۆ ئەوەی خوێنەر بە کردنەوەی ڕازە شاراوەکانیان خەریک بکەن. نالی لە دوادێڕی چامەکەیدا ئومێدەکانی بە قەدەر دەسپێرێ.

**ئایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە،**

**یا مەسڵەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی سوور؟**

(یەومی نەفخی سوور) ئاماژەیە بۆ ئەو شوێنەی کە لە ڕۆژی دواییدا هەموو هەڵدەستنەوە و دادگایی ئەزەلی دەست پێ دەکات. با ڕووی قسەمان لەو ڕۆژە و لەو شوێنە بێ کە مرۆڤەکان لێی ڕادەوەستن و چاوەڕێی ئەنجامی کردەوەکانیانی لێ دەکەن. بە بۆچوونی نالی لەو ڕۆژەدا (یەومی نەفخی سوور) و لەو شوێنەدا بە هاوڕێ و خۆشەویستانی شاد دەبێتەوە. نالی دوای ئەو هەموو پرسیار و بۆچوونانەی دەیڵێ، لەپڕ بەسەر (مەقامی ڕوخسەت و بێمەوە)کەیدا دەکەوین، ئەمەش ئاماژەی ئەوەیە بێتەوە، یان مل بنێتە ئەم واقیعەی کە زەمەن بەسەریدا سەپاندووە، یان چاوەڕێی ئەو ڕۆژ و شوێنە بێ کە لە ڕۆژی دواییدا مەرامەکەی بێنێتە دی، ئەگەرچی لەپێش نالی شوێن و کاتی ڕۆژی دوایی لە دەقە قورئانییەکانیشدا باس کراوە، بەڵام ئەم شوێنەی هەموو مرۆڤەکان تێیدا ڕادەوەستن و چاوەڕێی چارەنووسی ئەبەدییەتی لێ دەکەن کاتی ئێستا بوونێکی فیزیکی نییە و مرۆ نەیدیوە و ناتوانێ بیبینێ بەر یەکێک لە هەستەکانی بکەوێ.

**ئەندامە شوێن/** دابەشی سەر دوو جۆری تر دەکرێ:

**أ- ئەندامە شوێنی بەرجەستە/** ئەو شوێنانە دەگرێتەوە بە یەکێک، یان زیاتر لە ئەندامانی جەستە دروستبێ. بە واتایەکی تر نووسەر لەسەر لەشی مرۆڤ ئاماژە بە شوێنێک، یان زیاتر دەدات و دەستنیشانی دەکات و مەنزڵێکیان پێ دەبەخشێ، بەمەش جەستە دەبێتە شوێنی ئاماژەپێکراوی شاعیر.

**زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەیاڵ!**

**ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوتوور؟!**

هەریەک لە ئەندامەکانی (چاو، دڵ، زار) بوونێکی فیزیکییان هەیە و دەبنە ئەندامە شوێنی بەرجەستە.

**ب- ئەندامە شوێنی نا بەرجەستە/** ئەم شوێنانە دەگرێتەوە کە (مەعنەوی)ن. وەک (ڕوح، هزر، خەیاڵ،...تاد) دروستی دەکەن.

**داخۆ دەروونی شەق نەبووە (پردی سەرشەقام)؟!**

**بیر و فوتادە تەن نەبووە (داری پیرمەسوور)؟!**

(دەروون) شوێنێکی نابەرجەستەیە، ئەگەرچی بە ماددە چوێنراوە. لەبەر ئەوەی بوونێکی فیزیکی پێ بەخشراوە، ئەویش بە ئاماژەی (شەق بوون) دەروون بەشێکی هەست پێکراوی نادیارە، بەشێکە لە مرۆڤ، بۆیە بە ئەندامە شوێنی نا بەرجەستە پۆلێن دەکرێ.

**سووتا ڕەواقی خانەیی سەبرم، دڵ و دەروون**

**نەیاوە غەیری گۆشەیی زیکرێکی، یان سەبوور**

بەهەمان شێوە لە (خانەی سەبر) ئەندامە شوێنی نابەرجەستە دروست بووە.

**شوێنی دەروونی/** ئەو شوێنەیە کە پێوەندییەکی پتەوی بە دەروونی شاعیرەوە هەیە، زۆربەی کات لە ئەنجامی دوورکەوتنەوە لە زێد، یان شوێنی یادگارییەکانی نووسەر دروست دەبێت و نووسەر ناتوانێ بەسەریدا زاڵ بێت و لەبیری بکا، بۆیە لە باسکردنی ئەم جۆرەی شوێندا هەستی دەروونی نووسەر بە زەقی ڕەنگ دەداتەوە و پەیوەستە بە لایەنی دەروونی خودەوە، نەک چوارچێوەی قەبارەیەکی ئەندازەیی دیاریکراو.

**وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار**

**وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی (شیوەسوور)**

نالی لە پلەیەکی بەرزدا باسی (ئاه و خاکی کۆی یار و ئەشک) دەکات، ئەو دەیەوێت لە ڕێگەی هەستی دەروونییەوە وێنەی شوێنەکان بەرزتر لە خۆیان نیشان بدات، چونکە نالی دەیەوێ وێنەی فەزایەکی دەروونی بۆ خوێنەر بخولقێنێ تا لەم ڕێگەیەوە ئەو حاڵەتە دەروونییە کەپت کراوە بەیان بکات.

**مەیلێ بکە لە سەبزە درەختانی مەدرەسە:**

**ئەوراقیان موقەددیەیی شینە، یان نە سوور؟**

**حەوزی پڕی کە نائیبی دیدەی منە لەوێ،**

**لێڵاوی دانەهاتووە وەک سەیلی (شیوەسور)؟**

**ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی باز و کەوشەکە،**

**یاریی تیایە، یان بووەتە مەعرەزی نوفوور؟**

نالی بە وردی ئەو بارە دەروونییەی ناخی خۆی لە چامەکەدا بە شێوەیەکی یەک بەدوای یەکی دەچنێ. بەجۆرێک مەبەستییەتی سۆزی دەروونی خوێنەر بجووڵێنێ و ئاسەواری لەسەر بەجێ بهێڵێ، ئەمەش بەهۆی دەربڕینی هەستێکی دەروونییانە بەرانبەر ئەو

شـوێنانەی کـە ناویان دەهێنێ ئەو شـوێن و خـانەقـا و حوجرە و حەوشەی پڕ لە گوڵ...تاد، کە لە دووره ولاتەوە بیـریان دەکات و لەحاڵی ئێسـتـاشـیـان دەپرسێ. تەنیـا خـوێنەر (کە وجـوودی هەیە لەو شـوێنەی کـە نالی باسی دەکـــات و لێی غــــیـــابە) دەیبــــینێ، چونکە وەڵامی پرسـیـارکردنەکـانی شـاعـیـر لەلای خـوێنەر (خـوێنەری ئەوسا) دەست دەکەوێ، کە بـارودۆخـەکـە بە چ لایەکـدا شکاوەتەوە، ئەمە وا دەکات خوێنەریش بخاتە ئەو کەشە دەروونییـە، ئەگـەرچی نالی خۆیشی تاڕادەیەک زانیـاری لەسەر نیشتمانی ژێر دەستی عوسمانییەکان هەیە.

نالی لە چامــەی (قـوربـانی تۆزی ڕێگەتم)ـەکـەیدا یەکـێتـیـیـەکی بەهێـزی لەنێـوان (خـۆی- شـوێنەکـان- خوێنەر) دروستکردووە، ئەم یەکێتـییەش بەهۆی ئەوەوە دروستبووە نالی خۆی لە غیابی ئەم شوێنانە نیشان داوە و خوێنەری بە پێچەوانەوە داناوە، هەروەها ئەو بارودۆخە نالەبارەی ئەوسا کە تورکی داگیرکەر دروستی کـردبوو، هەروەها ئاشنایی شـوێنەکـان چ لەلای شـاعـیـر و چ لای خـوێنەر، کـە ئێـســـتـــا بوونیـــان هەیە هەم نالی و هەم خوێنەریش تێـیـدا ژیاوە، هەر بۆیە ئەو فـەزایەی بەهۆی پرسینی لە حاڵی شوێنەکـان لەم چامـەیەدا وای کـردووە شـوێنەکـان مـۆرکـێکی مـێـژوویی بەخـۆیانەوە ببـینن و بە مـێـژووییش دەمـێننەوە، چونکە نالی ڕاسـتگۆیانە ناوی شـوێنەکـانی هێناوە و ئیـسـتـێـتـیکای پێ بەخـشـیـون و هەوڵی جددی داوە شوێنەکان بە سادەیی و ڕەوانی نیشان بدات و گـرێ و لێـلـی لەناوهێنانی شـوێنەکـان دروست نەکـات، بۆیە خوێنەر لە خـوێندنەوەی چامـەی (قـوربانی تۆزی ڕێگەتم) و شــوێنەکــانی هیـچ گـرفــتی بۆ دروست نابێ.


**سەرچاوە بەکارهاتووەکان:**

**کتێب:**

**١- دیـوانـی نـالـی، لـێـکـۆڵـیـنـەوە و لـێـکـدانـەوەی مـــــەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیحی عەبدولکەریم، چاپی حەوتەم، چاپخانەی انتشارات کردستان، سنە، ١٣٨٩هجری.**

**٢- ڕێبـوار سـیـوەیلی، کـتـێبی نالی، چاپ و بلاوکـردنەوەی موکریان، هەولێر، ٢٠٠١.**

**٣- سـەباح ئیـسـمـاعـیـل، چەمک و ئیـسـتـێـتـیکای شوێن لە ئەدەبدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر٢٠١١.**

**٤- لوقـمـان ڕەئووف، ڕەهەندەکانی شوێنکات لە دەقە والاکانی شێرکۆ بێکەسدا، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٢.**

**گۆڤار:**

**٥- ئارام سدیق، چەمکی شوێن لە کۆمەڵە چیرۆکی (بلیتێک بۆ جەهەننەم) ی ئارامی کـاکـەی فـەللاح، گـۆڤـاری ئاینده، ژ ٩٤ ساڵی ٢٠١١.**

**٦- تریفـە مـحـەمـەد ئەحـمـەد، کـات و شـوێن لە چیـرۆکـەکـانی شـێـرزاد حـەسـەن دا، گـۆڤـاری ڕامـان، ژمـارە ٢٠ و ٢١، سـاڵی ١٩٩٨.**


**پەراوێزەکان:**

**١- تریفە محەمەد، گ. ڕامان، ژ٢٠-٢١، ل٣٧.**

**٢- ئارام سدیق، گۆڤاری ئاینده، ژ٩٤.**

**٣- سەباح ئیسماعیل، ل٢٩.**

**٤- ئارام سدیق، گۆڤاری ئاینده، ژ٩٤.**

**٥- سەباح ئیسماعیل، ل٣٣.**

**٦- ڕێبوار سیوەیلی ل٤٩.**

**٧- سەباح ئیسماعیل، ل٣٠.**

**٨- لوقمان ڕەئووف، ل٧٤.**

*** بە پێــویســتی دەزانم مــانای ئەم دێڕە شــیــعــرە وەک لە دیوانەکەیدا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی شەرحیان بۆ کردووە بینووسمەوە: (وشەی لەندەهور بەواتای پیاوی چوارشانە و کەڵەگەت و ترسناک). واتاکەی:(ئاخۆ ناوەوەی خانەقا کەسانی خۆشەویستی نازداری تیایە کە ئەبن بە مایەی ڕووناکی بۆی، وەک چۆن دڵی ئادەمیزاد بە یادی خوا ڕووناک دەبێتەوە، یاخود پڕە لە کەسانی بەدکار و بەدفەساڵ و سیاچارە، وەک دۆزەخ کە پڕە لە گوناهبار و پیاوخراپی وا ڕێگەی چاکەیان لە خەڵک دەگرت). بڕوانە دیوانی نالی، ل١٩٩.**